


بسم الله الرحمن الرحيم
الذين يبلغون رسلت الله و يخشونه ولا يخشون احداً إلا الله وكفى بالله حسيباً
سورة الأحزاب ٣٩

الرسالة

# پەیام

بڵاوکراوەیەکی مانگانەی ئیسلامی یە
ناوەندی ئیسلامی
بۆ دیراساتی شەرعی دەری دەکات

زمارە
٦

مانگی
جەمادی دووەم

ساڵی ١٤١٥ کۆچی

٦

# پەیام

## لەم ژمارەیەدا





# قورئان و سوننەت

## لە ڕێڕونی‌یەکانی قورئان دا

﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُمْ بِمَا كَسَبُوا أَتُرِيدُونَ أَنْ تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ وَمَنْ يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا﴾.

٨٨ النساء

خودای گەورە لەم ئایەتەدا ڕەخنە لە ئیماندارارن دەگریت لە بابەت جیاوازی رایان دەربارەی موونافیقان و دروست بوونی دوو ڕای جیا بەرامبەر مەسەلەکەیان.

وەك دەفـەرمـوێ:ـ ئەوە چیتـانـە گەلی موسلمانـان بوونەتە دوو تیپی جودا دەربارەی مەسەلەی ئەو موونافیقانە، لە کاتێکدا کە خودای گەورە ـ دەیانگێرێتەوە بۆ حوکمی کافران پاش ئەوەی کە لە ئیسلام پاشگەز بوونەوە وەرگەران بۆ ریزی هاویـەش پەیداکـەران واتـە بە هۆی عاسێ بوون و جیابـوونەوە لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾و وە دواکەوتنی ناحەق.

ئایا هەوڵ دەدرێ هیدایەتی کەسانێك بدرێ کە ویستی خودا وایە لە حەق گومـرابن لەبـەر ناراستی ئیمانـەکـەیان یان خودا گومرایان دەك لەبەر گوناح و تاوانـەکانیان ﴿بێ گومان تەنانەت دیتنەوەی رێچکەیەکی هیدایەت بۆ ئەمانە کارێکی ئەستەمە﴾.

**ئەمانەش چەند خالێکن کە دەرئەنجامی ئەم ئایەتە پیرۆزەی سەرەوەن:ـ**

(١) دروست نی‌یە موسلمانـانْ ببنـە دوو کۆمـەڵ بە هوی دەغـەڵ و مونـافیق وهەرلگەراوان. بەلکو خودای گەورە گلەیی لە کەسانێك دەکا کە بە هۆی ئەم مەسەلەیە جوداکاری ولیك دابرانیان تێدا هەیە.ـ

(٢) لەم سەردەمەی ئیستاشدا گەلێك حاڵەتی لێك دابران و جودایی لەناو موسلمانان بەدی دەکەین بە هۆی مونافیق و هەلگەراوەو تاغوتیان.
(٣) دروست نی یە کە هیچ کەسێکی مونافیق یان هەلگەراوە بە موسلمان جسێب بکەین. چونکە نە لە دەست ئیمەیەوە نە لە پیرو بۆچوونیان داهەیە کە یەکێك لەمانە بێتە ریزی موسلمانان ﴿أَتُرِيدُونَ أَنْ تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ﴾.
(٤) پیویستە کە موسلمانان بە وردی لەم ئایەتە پیرۆزە تێفکرن تاکو جیاواز و ناکوك و دابراو نەبن بە هۆی کۆمەلیك کە خودا گومرای کردون بەم شیوەیەش برایەتی و هێزو یەکێتی ریزەکانیان لە دەست بدەین بە هۆی قەومێك کە ناتوانین ریچکەیەکی هیدایەتیشیان بۆ بدۆزینەوە.

## لە ڕێرونی یەکانی فەرموودەدا

لە «جابیری کوری عەبدوللا» ﴿خوا لێی رازی بێ﴾ دەلێ: پیغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کاتێك و وتاری دەدا دەیفەرموو:ـ ﴿أما بَعْدُ فَانَّ خير الْحَدِيثِ كتاب الله، وخَيرَ الهَدي هدي مُحَمد ﴿ﷺ﴾ وشَرُّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها وكُلُّ محدثةٍ بدِعةَ وكُلُّ بدعةٍ ظَلالة﴾
**رواه مسلم**
**اما بعد** :ـ ووتەیەکە بۆ ئەوە دەهینریتەوە تاکو گرنگی بە باسەکەی دواوەی بدرێ.
**الحديث** :ـ ئەو قسانەی کە دەکرێ و خەلك دەیگوازنەوە.
**كتاب الله** :ـ قورئان.
**الهدي** :ـ ریگا.
**المحدثان** :ـ کۆی (محدثة)یەو بریتی یە لەو شتانەی کەنەلە کتیبی خواو نەلە سونەتی پێغەمبەرا ﴿ﷺ﴾ەی دانین.
**بدعة** :ـ ئەو شتانەی کە بۆ ئاینەکە زیاد دەکرین و لەگەڵ ئەو شتانەش تێك ناکەنەوە کە لە پیغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ هاتوون.

**پەندو عیبرەتەکان:-**

(١) لەو مەسەلانەی کە پیغەمبەر ﴿ﷺ﴾ گرنگی پێ دەدا لە ووتارو ئامۆژگاری‌یەکانی دا بۆ موسلمانان مەسەلەی دەست گرتنە بە قورئان و سونەت.

(٢) ئاینی ئیسلام لە هەموو روێکەوە روون و ئاشکرایەو دوورە لە نادیاری‌و کورتبڕی حەلاڵ حەرامی تەواو لیك جودا کردوتەوەو حوکمی هەریەکەیانیشی دیاریکردووە.

(٣) جا هەر یەکیك ڕیگایەکی جیا لە ڕیگای قورئان وسونەت بگریتە بەر ئەوا ئەو کەسە بیدعە جی‌یەکی گومرایە. چونکە زیادکردنی هەر شتێك بۆ ئاینەکە تۆمەتی نەقوستانی دەداتە پاڵ خودای کار بەجی‌و شەرعە پیروزەکەی. خوای گەورەش دەفەرموێ:- ﴿اليَومَ اكْملتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَاَتْمَمتُ عَلَيكُمْ نِعمَتي وَرَضيتُ لَكُمُ الأسْلامَ ديناً﴾.

(٤) بۆیە لەسەر موسلمانان پیویستە کە بەڵێن لەگەڵ خۆی و دەورووبەرەکەی دادوویات کاتەوە بە دەستەبەری (التزام) شوینکە وتنی قورئان و سونەت و وەخۆوە گرتنیان (ملازمتهما) وئیش کردن بەپێی فرمانەکانیان بەبێ زێدە کردن لێ کەم کردنەوە.

(٥) ووتارو ئامۆژکازی پیویستە «دەستکرتن بە قورئان و سونەت» بگرێتە خۆی.

(٦) زێدەکردن بۆ ئاین وەکو لێ کەم کردنەوەیەتی چونکە خودای گەورە ئاینەکەی کامل کردووە.

(٧) هەر شتێکی لە شەرع دا نەهاتبێ و لەگەڵ بەرنامەکەی نەگونجێ ئەمە گومرایی‌یە.

# دۆستایەتی و دوژمنایەتی
## «الموالاة و المعادات»

مەسەلەی «دۆستایەتی و دوژمنایەتی» لەلای زۆر کەساندا بۆتە مەسەلەیەکی لاوەکی، فەرامۆشیان کردووە.
لەم سەردەمەدا موسڵمانانی وا پەیدا بوونە، مەسەلەی «دۆستایەتی و دوژمنایەتی»یان لەلادا بووەتە مەسەلەیەکی لاوەکی و هەر بایەخیشی پێ نادەن.
چونکە ئەوانە واتێ دەگەن؛ ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەکی عەقیدەیی نی یە و بازنەی عەقیدە نایگرێتەوە.
بۆیە دەستیان دەخەنە نێو دەستی کافران و بەگەرمی دەیگوشن! خۆشویستن و سۆزو پشتگیری خۆیانیان بۆ دەردەبڕن! یارمەتیان دەدەن و بە زارو بەهێز پالپشتی یان دەکەن!.. لەولاوەش دەبینی ـ لە هەمان کاتدا ـ ئیماندارەکان تووشی جۆرەها ئەشکەنجە دەکرێن و بە جۆرەها شێوە بەرەنگاری دەکرێن!!

## بانگەوازێکی بەتاڵ

جۆرە بانگەوازێك هەیە، دوژمنانی ئیسلام و مونافیق و مورتەددەکان، تەنانەت موسڵمانە داعی یە ساویلکەکانیش، بانگەشەی بۆ دەکەن و رەواجی پێ دەدەن. بانگەوازەکەش بریتی یە لە نزیك کردنەوەی دینەکان لە یەکتری. مانا ئیسلام و دیانێتی و جولەکەیی لەیەك نزیك بکەنەوە، قالبێکی وا دابرێژن جێگەی هەرسێ دینی تێدا بێتە بە جۆرێك هیچ نەسازی و دژیاتیەکیان لەگەڵ یەکدا نەمینێ وە ئاشنایەتی و ناسیارێتیکی وایان بۆ برەخسێنن جیگەی لەیەك ترازانیان پێوە نەمێنێ!!..
ئەم بانگەوازەش لە ژێر دروشمی «دین بۆ خوایەو نیشتمانیش بۆ هەموانە» نەخشەی بۆ دەکێشرێ!!

لێرەدا دەمانەوێ ئەو بڕیارەی خوا بە بیری هەموو ئەم جۆرە کەسانی بهێنینەوە، کە بەهیچ شێوەیەك هەق و باطیل لەگەڵ یەکدا کۆنابنەوەو بە یەکتر ئاشنا نابێ. ئەدی ئەوە نی‌یە؟ خوا دەفەرمووێ:ـ ﴿ولَنْ ترضىٰ عنك اليهود ولا النصارىٰ حتىٰ تتَبعَ مِلَّتَهُمْ، قل إنّ هدىٰ اللهِ هو الهدىٰ، ولئِن اتبعت اهوائهم بعد الذي جاءت من العلم مالك من الله من ولي ولا نصير﴾.

بقرة ـ ١٢٠

## بەرەو دۆستایەتی ئیمانداران و دوژمنایەتی کافران

بۆیە ئەمڕۆ موسڵمانان زۆر پێویستداری ئەوەن دۆستایەتی خۆیان تەنها بۆ ئیمانداران و، دوژمنایەتی خۆیان تەنها بۆ کافران دەربڕن. چونکە کوفر وا لە هەموو لایەکدا خۆی لەم دینە دائووساندووەو و، بە هەموو شێوازێك هەوڵی بنەبڕ کردنی ئەم دینە دەدات.

ئەم جەنگە سێ قۆڵی‌یەی کە دیان و جولەکەو بت پەرستەکان لە دژی ئیسلامدا بەرپایان کردووە، لەگەڵ ئەوەی مونافیق و مورتەدوو بوسوڵمانە دین فرۆشەکانیش خەمخۆریانن، ئەم جەنگە هیچ شتێ نی‌یە بەرەنگاری بێتەوە تەنها یەك گری و یەك ڕیزی ئیمامدارەکان نەبێ. هەروەکو خوا دەفەرمووێ:

﴿إن الله يحب الذين يقاتلون في سبيله صفا كأنهم بنيات موصوص﴾

صف ـ ٤٤

وە هەروەکو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾یش دەفورمووێ:ـ ﴿مثل المؤمنين في توادّهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد، اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمىٰ﴾ متفق عليه

## هەڵوێستی شەرعی نەك بەرژەوەندی

موسڵمانینە! دەی بۆ عەقیدە ڕاستەکەی ئیسلام بگەڕێنەوە، دۆستایەتی و یەکتر ویستی لە نێو خۆتا تەطبیق بکەن، چونکە ئەمە فەرمانی خواو پێغەمبەرە،

پاشان کوفر هەمووی هاوهەڵوێستن بۆ لە نێو بردنی ئیسلام و موسڵمانان.
خۆ ئەگەر ئێوە پشتگیری یەکتر نەگرن و یەك نەگرن، ئەوا چەندین فتنەو فەسادی بەرەو رووتان دەبێتەوە، وەکو خوا دەفەرمووێ: ﴿والذين كفروا بعضهم اولياء بعض الا تفعلوه تكن فتنة في الارض وفساد كبير﴾.
با دوژمنـایەتی رقەبەریتان تەنها بو کافر و موجریمان بێ، وەکو ئیبراهیمی پێغەمبەر عليه السلام کەخوا دەفەرمووێ: ﴿اذ قالوا لقومهم إنا برءاؤ منكم ومما تعبدون من دون الله وبدأ بيننا وبينكم العداوة والبغضاء ابداً حتى تؤمنوا بالله وحده﴾ با حەزرەتی ئیبراهیم ببێتە پێشرەو و پێشەنگتان.
لە خوا بترسن و سەرنجی ئەو فەرموودانە بدەن، بزانن چۆن گەف و هەرەشە لەو کەسانە دەکات، کە حەز دەکەن یان وا دەکەن کۆمەڵی ئیماندارانا تووشی ریسـوایی ببن و کۆمەڵی زۆرداران بە سەریاندا زاڵ ببێ. وەیان خۆشویستنی خۆیان بۆ کافران دەردەبرن.
پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێ: ﴿ما من امرئ مسلم يخذل امرءاً مسلماً في موضع تنتهك فيه حرمته وينتقص فيه من عرضه، الا خذله الله تعالىٰ في مواطن يجب فيها نصرته، وما من امرئ ينصر امرءاً مسلماً في موضع ينتقص فيه من عرضـه وينتهك فيه من حرمته الا نصره الله عز وجل في مواطن يحب فيها نصرته﴾ اخرجه ابوداود وحسنه الالباني.
هەروەها دەفەرمووێ: ﴿يا معشر من آمن بلسانه ولم يدخل الايمان قلبه لا تغتابوا المسلمين، ولا تتبعوا عوراتهم فانه من اتبع عوراتهم يتبع الله عورته، ومن يتبع الله عورته يفضحه في بيته﴾.
ئیسلام وەکو خوا دەیەوێت تەطبیقی بکەن نەك وەکو خۆتان دەتانەوێ، مانا ئێوە خۆتان لەگەڵ ئیسلامدا بگونجێنن، نەك ئیسلام لەگەڵ خۆتاندا بگونجێنێت.
بەناوی بەرژەوەندی بانگەوازەوە بە لارو وێری هەنگاو مەنێن، چونکە خوا دینەکەی تەواو کردووە، هەر خۆیشی بە بەرژەوەندی دین و بانگەوازەکەی زانا ترە.. ﴿ءأنتم اعلم ام الله﴾.

بشزانن خوا به هۆی عەقیدەی ڕاست و یەکریزی و شوێن کەوتنی قورئان و سوننەتی پیغـەمبـەر ﴿ﷺ﴾ەوه سەرتـان دەخات. ئەنجا ئەگەر دەتانەوێ به شکـۆمـەندی و بەعیززەتەوه بژین، ئەوا برۆن عیزەت لەلای خوا وەدەست هێنن.. ﴿ولله العزة ولرسوله وللمؤمنين﴾، ﴿وأن العزة لله جميعاً﴾.

له لۆمەی لۆمەکەران مەترسن گازاندەو گلیەیی خەڵکی نەفام نەتان رووخێنێ سەرکۆنەی بەندە له عەقیدەتان دانەبەزێنێ

● با خەمی گچکه و گەورەمان بە تەنها ئیسلام و موسڵمانان بێ، دۆستایەتی کردنەکانمان تەنها لەگەڵ کۆمەڵانی ئیماندار بێ، بۆ ئەوەی دەستێکی پۆلایینی به هێزمان بۆ بێتە دی.

● با ڕەزامـەنـدی خوامـان له لادا گرینگترین و گەورەترین شت بێ، با خۆشویستن و رق لێ بوونەوەمان تەنها لەبەر خودا بێت، بۆ ئەوەی وەبەر ئەم ئایەتـه بکـەوین ان شاءالله.. **﴿والمؤمنـون والمؤمنـات بعضهم اولياء بعض يأمرون بالمعروف وينهون عن المنكر ويقيمون الصلاة ويؤتون الزكاة ويطيعون الله ورسـوله اولئك سيرحمهم الله ان الله عزيز حكيم. وعد الله المؤمنين والمؤمنان جنات تجري من تحتها الانهار خالدين فيها ومساكن طيبة في جنات عدن ورضوان من الله اكبر، ذلك هو الفوز العظيم﴾**

التوبة

## فیقه

# «تەواوکەری پێشووه»

### چوارەم/ سیواك

بەکـارهێنـانی سیواك یەکێکه له سونەته فرچکی‌یەکان (الفطرة)، بۆیەش لێرەدا هێناومانەتەوه چونکه گرنگی‌یەکی زۆری هەیەو خەڵکیش فەرامۆشیان کردووه.

أ ـ بەکارهێنانی سیواك لەلای غەیری ظاهری یەکان سونەتە، چونکە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفـەرمـووێ: ﴿لـولا ان اشق علىٰ امتي لامرتهم بالسواك عند كل صلاة﴾ رواه البخاري ومسلم.

ب ـ لەسێ کاتدا موستەحەبەو تەئکیدی لەسەر کراوە.

١ـ لە کاتی نوێژدا ـ هەروەکو لە فەرموودەکەی پێشوودا دەردەکەوێ ـ.

ئەم بەکـارهێنـانـە لە کاتی هەڵگرتنی دەستنوێژدایان بەر الله اکبری نوێژ دابەستندا دەگرێتەوە. چونکە زۆر فەرموودە لەم بارەوە هاتوونەتەوە.

٢ـ لە دوای لە خەوهەڵسان، لەبەر ئەو فەرموودەیەی حوذەیفە ـ خوا لێی رازی بێ ـ: ﴿کان رسول الله ﴿ﷺ﴾ اذا قام من الليل يشوص فاه بالسواك﴾ متفق عليه.

٣ـ لە هەمـوو کاتێکـدا موستـەحـەبـە، لە کاتی چووەنـەوە ماڵێ، لەکـاتی خوێندنەوەی قورئان، لەو کاتەی ماوەیەکی زۆر دەمی نەکردۆتەوەو قسەی نەکردووە.

## پێنجەم/ سوونەتەکانی دەستنوێژ:

### ١ـ بسم الله کردن:

بەڵام هەندێ زانا بە واجبیان داناوە لەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کە لە ئەبو هورەیرەوە بە مەرفوعی ـ ریوایەت کراوە:

﴿لا صلاة لمن لا وضوء له ولا وضوء لمن لم يذكر اسم الله عليه﴾. صححه الالباني.

جا ئەگەر واجبیش نەبێ ئەوا سونەتێکی موئەککەدەیە.

**٢ـ سێجار شووشتنی هەردوو دەست پێش ئەوەی دەستی بنێتە ناو ئاوی دەفرەکە.** ئەمەش چونکە ئیمامی عوثمان بەم جۆرە وەسفی دەستنوێژ ی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ی کردووە.

ئەمە بۆ واگا (غير النائم) یان، بەڵام بۆ ئەوانەی نووستوونەو لەخەو هەڵساون

راستتر وایە بۆیان واجب بێ. ئەمەش لەبەر ئەو فەرموودەیە: ﴿اذا انتبه احدكم من منامه فلا يدخل يده في الاناء حتى يغسلها ثلاثاً﴾ رواه مسلم (دەست تا مەچەك دەگرێتەوە).

٣ـ **موبالەغەکردن** لە ئاو لەدەم و لە لووت وەرکردن (المضمضة والاستنشاق). بەڵام ئەوەی بەرۆژوو بێ نایگرێتەوە

٤ـ **هەڵخرشاندنی ردێنی بۆر** (تخليل اللحية الكثة): مانا لوێچێك (كفاً) ئاو هەڵدەگرێ و بەژێر چەناگەیەوە دەیباتە ناو ردێنیو دەستی بە پەنجەکراوەیی دێنێو دەبات. بۆ ئەوەی بنی مووەکان جوان تەڕ ببێ.

٥ـ **دەست پێداهێنان بە کەلێنی پەنجەکان**: لەبەر ئەو فەرموودەیە ﴿اسبغ الوضوء وخلل الاصابع﴾ رواه احمد وابن حبان وابو داود والترمزي والنسائي.

٦ـ **مەسح کردنی هەردوو گوێ**: بە ئاوێکی نوێ دەرەوەو ناوەوەی گوێیەکانی مەسح بکات.

٧ـ **بە پێشخستنی لای راستە**، لەشوشتنی هەموو ئەندامەکان دا.

# قورئاناسی

## «علوم القران»

## مەککەییو مەدینەیی

**اـ پێناسینی مەککەییو مەدینەیی**: بەپێی ئەم رێگایانە، ئایەتە مەککەییو مەدینەیەکان لە یەکدی جودا دەکرێنەوە:

١ـ بەگوێرەی گوێ لێبوون:

ئەم رێگایە متمانە دەکاتە سەر ئەو گێردراوە (روایة) صەحیحانەی کە لە هاوەڵ (سەحابە) و شوێنکەوتوو (تابیعی)ەکانەوە هاتوونەتەوە، ئەو هاوەڵانەی لەگەڵ

سروش (الـــوحـــي) دا ژیاون و هۆی هاتـنــــه خوارەوەشـیان بینـیوە. . ئەو شوێنکـەوتـووانـەی کە لە هاوەڵـەکـانـەوە چۆنیەتی هاتنـە خوارەوەو رووداو و مەسەلەکەیان زانیوەو بیستوویانە.

بەڵام لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ەوە هیچیان نەبیستووە

## ٢ـ بەگوێرەی قیاس و ئیجتیهاد

ئەم ڕێگـایە متـمانـە دەکاتە سەر ڕووخسارو تایبەتی‌یەکانی (خصائص)ی ئایەتە مەککەیی‌و مەدینەیی‌یەکان. بۆ نموونە: ئەگەر لە سورەتێکی مەککەیی‌دا ئایەتێکی وای تێدا بوو رووخساری مەدینەیی بەخۆوە هەڵدەگرت یان رووداوی مەدینـەیی تێدا باسکرابوو، ئەوا بە ئایەتەکە دەگوترێ مەدینەیی، هەروەها بە پێچەوانەوە. ئەمەیە ڕێگای «بەگوێرەی قیاس و ئیجتیهاد»، بۆیە دەبینین هەر سورەتێك سەرگوزشتەی پێغەمبەران و ئوممەتە رابردووەکانی تێدا هاتبوو؛ پێ‌یان گوتووە مەککەیی.

وە هەر سوورەتێکیش فەرزێکی تێدا بێ پێ‌یان گوتووە مەدینەیی.

## ب ـ ژمارەی سوورەتە مەککەیی‌و مەدینەیی‌یەکان

١ـ مەککەیی‌یەکان «٨٢» سورەتن.

٢ـ مەدینەیی‌یەکان «٢٠» سورەتن.

٣ـ ئەوانەی ئیختیلافیان لەسەرە «١٢» سورەتن.

## جـ ـ جیاوازی نێوان سوورەتە مەککەیی‌یەکان و مەدینەیی‌یەکان:

### ١ـ لەبەرچاوگرتنی قسە لەگەڵدا کراوەکان «اعتبار المخاطب»:

مەککەیی‌یەکان؛ ئەو سورەتانەن کە ئاراستەکەیان بۆ خەڵکی مەککەیە.

مەدینەیی‌یەکانیش: ئەو سورەتانەن کە ئاراستەکەیان بۆ خەڵکی مەدینەیە.

بۆ نموونە: کە خوای تەعالا دەفەرمووێ ﴿یاأیها الناس!﴾ ئاراستەیەکی مەککەیی‌یانەیە، وە کە دەفەرمووێ: ﴿یاأیها الذین آمنوا!﴾ ئاراستەکەی بۆ خەڵکی مەدینەیە.

بەڵام ئەم ڕێسایە تا سەر نی یە چونکە سورەتی «بقرة» و «نساء» لەگەڵ ئەوەی کە مەدینەیین، کەچی ئاراستەی وایان تێدا هەیە بە «یا أیها الناس!» دەستپێکراوە.

**٢ـ لەبەر چاوگرتنی شوێنی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان**

مەککەیی یەکان: ئەو ئایەت و سوورەتانەن کە لە مەککەو دەوروبەرەکەی هاتوونەتە خوارەوە، وەکو میناو عەرەفات و حودەیبیە. مەدینەیی یەکان: ئەو ئایەت و سورەتانەن کە لە مەدینەو دەوروبەرەکەی هاتوونەتە خوارەوە، وەکو ئوحد و «قباء» و «سلع» کەواتە بەگوێرەی ئەم ڕێسایە بێ، ئەو سورەتانەی کە لە «اسفار» و تەبوك و بەیتولمەقدیسدا هاتوونەتە خوارەوە، ناوی مەککەیی یان مەدینەیان لێ نابێت.

هەروەها ئەو ئایەت و سورەتانەش کە لە دوای هیجرەتدا لە مەککە هاتوونەتە خوارەوە، پێیان دەگوترێ مەککەیی.

**٣ـ لەبەرچاوگرتنی کاتی هاتنە خوارەوەکە:**

بە گوێرەی ئەم ڕێسایە: مەککەیی یەکان: ئەو ئایەت و سورەتانەن کەبەر لە هیجرەت دا بەزیوون. ئەگەر چی لە شوێنێکی دیکەی غەیری مەککەش دابەزیبن.

مەدینەیی یەکان: ئەو سورەت و ئایەتانەن کە لە دوای هیجرەت دا دابەزیون، ئەگەر چی لە غەیری مەدینەش دا دابەزیبن. مانا بۆ نموونە؛ ئەگەر لە دوای هیجرەت لە مەدینەو عەرەفەش دابەزیبێ، ئەوا هەر بە مەدینەیی یە حیسابە.

وەکو ئەم ئایەتە: ﴿ان الله یأمرکم ان تؤدوا الأمانات الیٰ اهلها . .﴾ «نساء ٥٨»

هەر چەندە لە مەککەدا هاتۆتە خوارەوە، بەڵام هەر بە مەدینەیی حسێبە چونکە لە دوای هیجرەت دابەزیوە.

یان وەکو ئەم ئایەتە: ﴿الیوم اکملت لکم دینکم . . ﴾ (مائده ٣)
کە لە «حجة الوداع» هاتۆتە خوارەوە، بەڵام هەر بە مەدینەیی حسێب دەکرێ چونکە لە دوای هیجرەت دا دابەزیوە.
**ئەم رایە چاکترینی رایەکانە.**

# فەرمووده ناسی

## جۆرەکانی فەرموودە

فەرموودە دابەش دەکرێتە سەر دوو جۆر: فەرموودەی قودسی و فەرموودەی پێغەمبەر.

**فەرموودەی قودسی:**

١- ئەوەیە کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە خوای گەورە دەیگێڕێتەوەو دەیداتە پاڵ خودا جگە لە قورئان.

٢- بە (قودسی) ناو دەبرێ. لە (قودس)ەوە هاتووە کە پاك و بێ گەردی دەگەیەنێ چونکە لە خودای گەورە راهاتووەو هەر خوداش فەرموویەتی و دایرشتووە و بێ گومان پاکیشە لە هەموو شتێکی نارێك.

٣- کەواتە فەرموودەی قودسی سەرچاوەو ماناکەی لە خوداوەیەو و بێژە (لفظ)ەکەی لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ەوەیە. کاتێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لێی دەدوێ دەفەرموێ: ﴿قال الله تبارك وتعالىٰ﴾ یان دەفەرموێ: ﴿عن الله عز وجل کذا وکذا﴾ یان راوی دەڵێ:

﴿قال رسول الله ﴿ﷺ﴾ فیما یرویه عن ربه عز وجل﴾.

٤- دەشبێ کە فەرموودەی قودسی لە میانەی فەرموودەی پێغەمبەردا بێ وەك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرمووێ: ﴿کل عمل ابن ادم یضاعف له الحسنه بعشر امثالها الیٰ سبعمئة ضعف قال الله تعالیٰ الا الصوم فانه لي وانا اجز به﴾ رواه مسلم.

## [جیاوازی‌یەکانی نێوان حەدیسی قودسی و قورئان]

١ـ قورئان بێژە (لفظ) و ماناکەی لە خوداوەیە بەڵام فەرمودەی قودسی تەنیا ماناکەی لە خوداوەیە بێژەکەی لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ەوەیە.

٢ـ قورئان موعجیزەیەو خوێندنەوەی عیبادەتەو خوێنەرەوەکەی پاداشتی هەیە. بەهەر حەرفێك یەك خێری هەیەو هەر خێرێکیش دەقات دەکرێتەوە. بە پێچەوانەی فەرموودەی قودسی کە موعجیزە نی‌یەو خوێندنەوەی عیبادەت نی‌یەو خوێنەرەکەی پاداشتی هەیە بەڵام نەك بە قەد قورئان.

٣ـ قورئان هەمووی بە تەواتور بۆمان هاتووە کە قەطع و یەقین دەگەیەنی لە گواستنەوەی‌و نابێ بە تەنیا ماناکەی لێ بگوازرێتەوەو ناکرێ بێژەکانی بگۆردرێن و تەنانەت نابێ پیتێکیشی لێ بگۆردرێ.

٤ـ بە پێچەوانەی فەرموودەی قودسی کەموتەواتیرو ئاحادی تێدا هەیەو دەکرێ کە بەمانا بگێردرێتەوە بۆ یەکێك کە بێژەکە تێك ناداو لای نادا لە مانای ویستراو.

٥ـ حەرامە کە مرۆڤی غوسلی جەنابەتی لەسەر بێ‌و ئافرەتی بێ نوێژ و زەیستان قورئان بخوێنێ یان هەڵیگرێ. بە پێچەوانەی فەرموودەی قودسی کە نەگێرانەوە نە هەڵگرتنی حەرام نی‌یە لەسەر ئەو کەسانەی کە غوسلی جەنابەتیان لەسەر بێ‌و بێ‌نوێژ و زەیستان.

٦ـ نوێژ دروست نی‌یە ئەگەر قورئانی تێدا نەخوێندرێ بە پێچەوانەی فەرموودەی قودسی کە ئەگەر لە نوێژدا خوێنرا بەتاڵی دەکا.

٧ـ قورئان بە سروش (الوحي) هاتووە. هەرچی فەرموودەی قودسیشە دەبێ سروش بێ وە دەشبێ کە لە خەون دابێ.

## [جیاوازی نێوان فەرموودەی قودسی و فەرموودەی پێغەمبەر]

یەکەمین: فەرموودەی قودسی و فەرموودەی پێغەمبەر لەم شتانە تێك دەکەنەوە:ـ

١ـ هەردووکی بێژەیان لای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ەو مانایان لای خوای گەورەیە.

٢ـ دروستە کە هەردووکی بەمانا بگێردرێنەوە بۆ یەکێك کە بێژەکەی (اللفظ) لە مانای ویستراو لانەدا.

٣ـ دروست نی‌یه هیچ یه‌كێكیان له نوێژدا بخوێنرێن. ئه‌گه‌ر بخوێنرێن نوێژه‌كه به تاڵ ده‌كه‌ن.
٤ـ هه‌ر یه‌كێكیان ئه‌وه هه‌ڵده‌گرن كه موته‌واتیر یان مه‌شهور وه‌یان ئاحاد بن.
٥ـ هه‌ر یه‌كێكیان ئه‌وه هه‌ڵده‌گرن كه صه‌حیح یان حه‌سه‌ن یان زه‌عیف بن.
**دووه‌مـین:ـ فه‌رمـووده‌ی قودسی به‌م شتانه له فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ر جوودا ده‌بنه‌وه**
١ـ فه‌رمـووده‌ی قودسی به رێگـای سروش (الوحي) ده‌بێ به‌ڵام فه‌رمووده‌ی پێغه‌مه‌ر ﴿ﷺ﴾ ره‌نگه به سروش یان به ئیجتیهاد بێ به‌ڵام پێغه‌مبه‌ر ﴿ﷺ﴾ ئیجتیهادی هه‌ڵه‌ی په‌سند نه‌كردووه.
٢ـ فه‌رمـووده‌ی قودسی ده‌درێتـه پاڵ خوای گه‌وره چونكـه مانـاكـه‌ی له‌لای خوداوه‌یه به پێچـه‌وانـه‌ی فه‌رمـووده‌ی پێغـه‌مبـه‌ر ﴿ﷺ﴾ ده‌درێتـه پاڵ پێغه‌مبه‌ر﴿ﷺ﴾ چونكه بێژه‌و ماناكه‌ی له پێغه‌مبه‌ر ﴿ﷺ﴾ه‌وه‌یه.

## بۆ خوشكان

## بۆچی پیاو دوو ئه‌وه‌نده‌ی به‌شی ئافره‌ت وه‌رده‌گرێ؟

له‌وانه‌یه هه‌ندێ كه‌س پرسیار بكه‌ن بۆچی به‌شی ئافره‌ت نیوه‌ی به‌شی پیاوه له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی كه ئافره‌ت له پیاو بێ تواناتره‌و له‌و زیاتر پێویستی به پاره هه‌یه؟
**وه‌ڵام**: شه‌ریعه‌تی ئیسلام جیاوازی له نێوان به‌شی پیاوو ئافره‌ت دا كردووه له وه‌رگرتنی میراتدا. چه‌ندین حیكمه‌تی به‌رزیش له‌م مه‌سه‌له‌یه‌دا هه‌یه، له‌وانه:
**یه‌كه‌م**: ئافره‌ت پێداویستیه‌كانی بۆ دابین كراوه، چونكه خه‌رجی‌یه‌كه‌ی ئه‌ركی كوره‌كه‌ی یا باوكی یان براكه‌ی وه‌یا خود خزم و كه‌سانی دیكه‌یه‌تی.
**دووه‌م** : ئافـره‌ت ئه‌ركی مه‌سره‌ف كردنی هیچ كه‌سێكی پێ رانـه‌سپێرراوه. به‌پێچه‌وانه‌ی پیاو كه ئه‌ركی به‌خێوكردنی خاوخێزانه‌كه‌ی و ئه‌وانه‌ی له‌سه‌ره كه پێویسته مه‌سره‌فیان بكێشێ.

**سێیەم:** خەرجی یەکانی پیاو زۆرترەو ئیلتیزاماتی مەزنتری لەسەرە بۆیەش پیاو پێویستی بە پارە هەیە لە ئافرەت.
**چوارەم:** مارەیی ئافـرەت لەسـەر پیاوانە. هەروەها ئەرکی ئامادەکردنی خانو بەرەو خۆراك و جلو بەرگی ژن و منداڵەکانیشی لەسەرە.
**پێنجـەم:**- کرێی فێرکردنی منداڵان و پارەی چارەسەری نەخۆشی و نرخی داوو دەرمانی ئافرەت و منداڵان هەمووی لەسەر پیاوە نەك ئافرەت.
جگـە لەوانـەش گەلێك ئەرك و مەسرەفی تریش لەسـەر پیاون کە بەپێی شەریعـەتی ئیسلامی پیرۆز پێی راسپێرراوە. بە فەرمانی خودای بالادەست لەسەر شانی دانراوە:-
**﴿لينفق ذو سعة من سعته ومن قدر عليه رزقه فلينفق مما اتاه الله. . ﴾** الطلاق (٧)
جا لەم روانینە خێرایەدا. حیکمەتی گەورەی خودای کاربەجێیان بۆ روون دەبێتـەوە لە بواری جوداکردنەوەی بەشی (نێرینەو مێینە) چونکە هەر کەسێ ئەرك و ئیلتیزاماتی زیاتر لەسەر شان بێ، بەپێی مەنتیقی دادگەریو یەکسانی شایانێتی بەشی زێتر بێ.
لەگەڵ ئەوەش کە ئیسلام بەشی پیاوی دوو ئەوەندەی بەشی ئافرەت داناوە. ئافـرەتیشی بەرەحمـەت و میهـرەبانی داپۆشیوەو زیاتری داوەتێ لەوەی کە بە خەیاڵی دادێ. بەمە پێیەش ئافرەت لە پیاو ئاسوودەو شادترە. چونکە ئافرەت لەگەڵ پیاودا بەشدارە لە وەرگرتنی میراتدا لەگەڵ ئەوەی کە پابەند نی یە بە هیچ پاشەکی یەك و بەشی خۆی وەردەگرێ و هیچ نابەخشێ، پارەکە لەکە دەکات بێ ئەوەی هیچی لێ خەرج بکاو هاوبەشی پیاو بکا لە مەسرەفەکانی ژیان و پێداویستی یەکانی.
دیسان شەریعەتی ئیسلام ئافرەت پابەند ناکات بە سەرف کردنی پارەکەی بۆ خۆی یا بۆ منداڵەکانی هەرچەندە دەوڵەمەندو دەست رۆیشتووش بێت. لە کاتی بوونی مێر. چونکە مێردەکە بەرپرسیارە لە مەسرەف کردن بۆ ئافرەتەکەو منـداڵـەکـانیشیان. لە ماڵ و خۆراك و جل و بەرگە. هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ: **﴿وعلى المولود له رزقهن وكسوتهن بالمعروف﴾** البقرة ٢٣٣

● **میراتی ئافرەت بەر لە ئیسلام**

پێش هەڵاتنی رۆژی روونی ئیسلام ئافرەت هیچ بەشی لە میرات نەدەدرایێ. بە بیانووی ئەوەی کە ئافرەت ناجەنگێ و داکۆکی لە خێڵەکەی ناکات و دەیان گوت:ـ

(چۆن ماڵ بدەینە یەکێك کە نە سواری وولاغ ببێ و نەشمشێر هەڵگرێ و نە لە گەڵ دوژمندا بجەنگێ)!! بەم جۆرە ئافرەتیان وەکو منداڵێکی ساوا لە میرات بێبەش دەکرد.

لێرەدا توێژەرەوەی بەویژدان دەزانێ کە شەریعەتی ئیسلامی لە کاتێکدا هاتووە کە عەرەب زوڵمیان لە ئافرەت دەکردو لە میراتی مێردو باوکیان بێبەشیان دەکردن جا شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز بریاری دا کە ئافرەت مافی وەرگرتنی میراتی هەیە. میراتەکەش وەردەگرێ زۆر بەبێ منەتی و چاکەو دڵ پێ سوتانی کەسیشی لەسەر نی یە. بەڵکو یەکێکە لە فەرزەکانی خوای گەورە بۆیان.

کاتێك کە ئایەتەکانی میراتیش دابەزین عەرەبەکان ئەو مەسەلەیان زل هاتە بەرچاوو چاوەرێی نەسخ کردنەوەی حوکمەکە بوون. چونکە پێچەوانەی ئەوشتانە بوو کە لەسەری راهاتبوون. •

«ئیبنو جەریر» لە «ئیبنو عەباس» خوا لێی رازی بێ دەگێرێتەوە: ـ **﴿لما نزلت الفرائض التي فرض الله فيها ما فرض، للولد الذكر، والانثى، والابوين. كرهها بعض الناس وقالوا: ـ تعطى المرأة الربع، الثمن وتعطى الابنه النصف، ويعطى الغلام الصغير، و ليس من هؤلاء احد يقاتل القوم، ولا يجوز الغنيمة!! اسكتوا عن هذا الحديث، لعل رسول الله ينساه، او نقول له فيغيره. فقال بعضهم يارسول الله:ـ انعطي الصبي الميرات وليس يغني شيئاً. انعطي الجارية نصف ما ترك ابوها وليست تركب الفرس ولا تقاتل القوم؟؟﴾**. ئەوە کاری ئیسلامە لەگەڵ ئافرەت، زوڵمی لەسەر هەڵگرتووەو دوژمنکاری لەسەر لاداوەو میراتی داوەتێ لە کاتێك کەلێی بێبەش کراوە. لەگەڵ ئەوەی کە پیاوانیش پێیان خۆش نەبووە.

# ئاوڕدانەوەیەک بەلای سەید قوطب دا

## دوو جۆرن، ئەوانەی زوڵم لە سەید دەکەن

شێخ (موحەمەد سرور) لەکتێبی «دراسات في السيرة النبوية) پاش باسکردنی هەندێك لە هەڵەکانی سەید خوا لێی رازی بێ، وەکو قبوڵ نەکردنی مەسەلەی سیحر کردن لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و ، رەت کردنەوەی فەرمووده ئاحادەکان لە مەسـەلـە ئیتقـاتی‌یەکـان و، گومان بردن بەوەی کە فەرموودەی سیحر لەگەڵ ئایەتەکانی قورئان تێك ناکاتەوە. لە ژێر هەمان ناونیشانی سەرەوەدا دەڵێ:

- قوتابی و خۆشەویستەکانی سەید زوڵمی لێ دەکەن بەوەی لە رادەبەدەر سەریان بەکارەکانی سورماوە.
- سەرسامن بە پێگیری سەید لەسەر حەق و ئارامگرتنەکەی لەسەر ئازاردان لە رێگای خودا
- سەرسامن بەفراوانی ئاسۆکەی و پاکی فرچك و (الفطرة) قووڵی لێزانینی ئێمەش لەگەڵیاندا هاوراین بەرامبەر هەموو ئەو مەسەلانە.

بەڵام ئەم کۆمـەڵـە کەسە هەرگیز ئامادەنین گوێ بۆ یەکێك بگرن بڵێ: - (سەید) لە فلانە مەسەلە هەڵەی کردووە، هەر چەندە کە (سەید) هەڵەکەیشی کردبێ، چونکە مێشکەکانیان لە ئاست ئەم مەسەلەیە کلیل دراوە. جا ئێمە بە بەو کەسانە دەڵێین: - هیچ یەکێك لە زانا موسڵمانەکان نی‌یە کە یان شتی رەت کردۆتەوە یان شتی بەسەردا رەت کراوەتەوە، هەروەك کە (ئیمام مالیك) خوا لێی رازی بێ دەڵێ:

(سەید قوتب)یش رەحمەتی خوای لیّ بیّ هەردەم بۆ سەر حەق دەگەڕاوە کاتێك لای ڕون دەبۆوە، هەروەك کە لە چاپی دووەمی (ظلال)دا لە هەندێ لەو ڕاووبۆچوون و هەڵوێستانەی دا پەشیمان بۆتەوە کە لە چاپی یەکەم دا نووسیبووی.

جا ئەگەر پیاوێك بەخۆی لە هەڵەکانی پەشیمان و پاشگەز ببێتەوە، باشە لە بەرچی هەندێ لە خۆشەویستەکانی پیّ لەوە نانێن کە (سەید) لە هەندێ جێگای سنورداردا لە «ظلال»ەکەی هەڵەی کردووە؟!

وە ئەگەر ئەو گەنجانە هەر لەسەر ئەوە سوور بوون کە (سەید) هەڵەی نەکردووە. ئەوا پیّیان دەڵێین: کەواتە ئێوە (سەید)تان بردۆتە ڕیزی پێغەمبەرانی «مغصوم»، چونکە ئێوە پێتان وایە (سەید)یش مەعصومە. کە واش بیّ لەم کاتەدا ئێوە هیچ جیاوازی‌یەکتان نابیّ لەگەڵ رافزی‌یەکان چونکە رافزی‌یەکانیش بریاری مەعصومێتی‌یان بۆ هەندێ لە ئیمامەکانیان داوە. بیّ‌گومان ئەمەش ترازانە لە عەقیدەو مەنهەجی ئەهلی سوونەت و جەماعەت.

* وەبزانن: ـ خوا لە ئێمەو ئێوە خۆش بیّ ـ خۆشویستن سنوری شەرعی‌ی خۆی هەیە، بەزاندنی ئەم سنورەش لە هەندێ حاڵەتدا دەبێتە مایەی شرکی گەورە. ئەگەر مەبەستیشتانە برۆن بخوێننەوە داخوە لەسەرەتاوە چۆن دەستکراوە بە عیبادەتکردنی لات و عوززاو مەنات؟.

**جۆری دووەم:**

● وە هەرچی خەڵکانەکەی دیکەشە ئەوانە کە باسی (سەید) دەکەن تەنها لە میانەی هەڵە عیلمیەکانی‌یەوە باسی دەکەن.

جارێك دەڵێن سەید ئەشعەری بووە، ئەم جارە دەڵێن (سەید) لە بانگکەرانی بیرۆکەی «وحدة الوجود» بووە، یان قسەی زاڵمەکان دەڵێنەوەو دەڵێن «سەید خەواریج بووە»!

خۆ (سەید)یش ـ رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ . . نە ئەشعەری بووەو نە سۆفی، بەڵکــو ئەدیبیٚك بووەو قوتـابی‌یەکی «عـەقـاد» بووە، ئینجـا کاتیٚ ریٚگـەی بانگـەوازی گرتـووە رووی خۆی داوەتە زانستە ئیسلامی‌یەکان وەکو تەوحیدو تەفسیرو هی دیکە. خوای گەورەش لە زۆربەی نوسراوەکانی‌دا موەففەقی کردووە.

هەروەها لە نووسینەکانی‌دا چەند سیفەت و چاکی‌یەکی بەخۆوە گرتووە کە ئەمانەن:

★ (سەید) زۆر بویٚرو بەجورئەت بووە، لە ریٚی خوادا لە لۆمەی هیچ کەسیٚك نەترساوە. وە دەشیزانی تاغوتەکان لە دارشتنی نەخشەو پیلانی دژ بە ئەو دانەو دەیانەویٚ هەڵیفریٚوینن.

بەڵام ئەو قەت رووی خۆی نەداوەتە مەتاعی دونیا، لە پیٚناو رەزامەندی خواو وەدەستهیٚنانی بەهەشتدا پشتی لە مەنصەبی گەورەو پشت ئەستووری کردووە.

★ (سەید) بیٚ‌لایەن بووە، دەمارگیری بۆ هیچ مەزهەب و حیزبیٚك نەکردووە وە قەت لە بارەی خۆی نەدواوە، خۆ ئەگەر واشی کردبا ئەوا زۆر شتی هەقی پیٚ‌بوو.

چونکە لەم رۆژگارەدا چەندین کەسی وا دەبینین لە میانەی زاتی خۆیانەوە نەبیٚ باسی هیچ چاکەو گرنگی‌یەکی کەسانیٚکی تر ناکەن.

★ من هیچ نووسـەریٚکی وەکـو (سـەید) ناناسم لەم سەردەمـەدا وەکو وی گرفتەکانی ئەم رۆژگارەی خستبیٚتە روو، زۆر بە ئەمینی گرفتەکانی خستۆتە روو و چارەسەری گونجاویشی بۆیان داناوە.

★ لە توند گری (غلو) دوور بووە بەڵگەکانی لە قورئان و سوننەت و گۆتەی ئیمامەکان هیٚناوەتەوە.

★ سەردان و هاتوچۆی بۆ راڤەی ماناكانی لا الە الا اللە محمد رسو اللە زۆر بووەو و مەبەست و واتاكانی پەرستراوێتی «الالوهیە»ی روون كردۆتەوە وە بێداری و وریاكردنەوەی لە شرك و نیفاق دەربریوە.

★ لەگەڵ ئەوانەشدا تووشی هەندێ هەڵە بووە، بەڵام سۆفی نەبووە بەڵكو لە زۆر جێگای «ظلال»ەكەی دا رەددی سۆفی یەكانی داوەتەوە. وە لەوانەش نەبووە بڕوای بە مەنهەجی خەواریجەكان هەبووبێ، كتێب و نوسراوەكانی شاهێدی لەسەر ئەمە دەدەن وە لە ئیعتیزالی یەكانیش نەبووە. هەروەها لە سنوور دەرچووەكانی قوتابخانەی چاكسازیش نەبووە، چونكە لە تەفسیری سوورەتی «فەلەق» و «فیل» و لە كتێبی «خصائص التصور الاسلامی»دا رەددی ئەوانیشی داوەتەوە.

**ئینجا لە خوا بترسن هەڵەكانی ئەم پیاوە هێندە گەورە مەكەن و هێندەش بە گەورەی مەگرن.**

١

# بەچی لە خوا بپاڕێینەوە؟

حەزمـان کرد ئەم بابەتەیە بخەینە ڕوو بۆ ئەوەی گەنجە موسڵمانەکان لەو بیدعـەو کارە ناشـەرعی‌یانەی خەڵك لە دوعاو پارانەوەدا خۆیان پێوە گرتووە، ئاگادار بکەینەوە بۆ ئەوەی خۆیان لێ بپارێزن و خەڵکیشی لێ رزگار بکەن.

خەڵـك زۆر بە شەرعی و بە ناوەڕۆکی ئەم دینە پاکەی دەزانێ کە دەڵێت خوایە لەبەر خاتری خاتری فلان شێخ لێم خۆش ببە. یان خوایە لە بۆ خاتری ئەم چاکە لەم نەخۆشیەم قوتار بکەی! کە ئەوا هیچیان جائز نین، جا بفەرموون ئێوەو ئەو بابەتە.

خوای گەورە دەفـەرمـوێ: ﴿یـا أیهـا الـذین آمنـوا اتقو الله وابتغوا الیه الوسیلة﴾ مائدة ـ واتە، ئەی ئیماندااران! لە خوا بترسن و ئەو وەسیلەیە داوا بکەن کە بە ڕەزامەندی خواتان دەگەیەنێ، قەتادە دەڵێ: مانا نزیك بنەوە لە خوا بە هۆی ئەو کارانەی خوا پێ‌ی ڕازی‌یە.

تەوەسسولی شەرعی ئەوەیە کە خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە یان پیغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ڕوونی کردۆتـەوە، یان یارەکـانی کاریان پێ کردووە. پارانـەوەش (تەوەسولیس) زۆر جۆری هەیە، وەکو.

١ـ پارانـەوە بە هۆی «بڕوا هێنان»، وەکو خوای گەورە دەربارەی تەوەسسولی بەندەکانی خۆی دەفەرموێ: ﴿ربنا اننا سمعنا منادیاً ینادي للایمان أن آمنوا بربکم فآمنا، ربنا فاغفر لنا ذنوبنا وکفر عنا سیئاتنا وتوفنا مع الابرار﴾ ال عمران.

٢ـ پاڕانــەوە بە هۆی «بـەتـاکزانینی خودا» وەکو پاڕانەوەکەی حەزرەتی یونس ﴿علیه الصــلاة والســلام﴾ کە نەهـەنگەکە قووتی دابوو گوتی: ﴿فنادى في الظلمات أن لا اله الا انت سبحانك اني كنت من الظالمين، فاستجبنا له ونجيناه من الغم وكذلك ننجي المؤمنين﴾الأنبياء.

٣ـ پاڕانەوە بە هۆی «ناوەکان خوای گەورە» وەکو خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿ولله الأسماء الحسنى فادعوه بها﴾ ـ اعراف ـ هەروها پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾یش بەم جۆرە پاڕایتەوە: ﴿أسالك بكل اسم هو لك﴾ رواه الترمذي وقال حسن صحيح.

٤ـ پاڕانــەوە بە هۆی «سیفـەتـەکـانی خوای گەورە» وەکـو پێغـەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمویەتی: ﴿يا حي يا قيوم برحمتك استغيث﴾ حسن ـ رواه الترمذي.

٥ـ پاڕانەوە بە هۆی «کردەوە چاکەکانی خۆی» وەکو نوێژ، چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك، ڕاست گۆیی، قورئان خوێندن سەڵاوات لێ دان، خۆشویستنی هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾. . هەتد.

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾دا هاتووە، کە سێ کەس لەناو ئەشکەوتێك بوون بەردێك کونی ئەشکەوتەکەی لەسەر داخستن و نەیانتوانی بێنە دەرەوە، ئینجـا بە هۆی «کردەوە چاکەکانیان» لە خودا پاڕانەوەو خوداش دەرگاکەی بۆ کردنەوە. کردەوە چاکەکانیان ئەوانە بوون، چاکە کردن لەگەڵ دایك وباوك، حەقدانی کرێگرتە.

٦ـ پاڕانەوە بە هۆی «واز هێنان لە گوناهـ» وەکو ئارەق خواردنەوەو زینا کردن چونکە یەکێك لەسێ کەسی ناو ئەشکەوتەکە، بەوە لە خوا پاڕاوە کە لە ترسی خودا وازی لە زینا هێناوە.

٧ـ تەوەسسول کردن بە هۆی دوعاو پارانەوەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾و پیاو چاکانی زیندوو چونکە کاتی خۆی: «کابرایەکی کوێرە چووە لای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾و پێی گوت: دوعـام بۆ بکـە خودا چاکم بکاتەوە، ئەویش فەرمووی؛ ئەگەر دەتەوێ دوعات بۆ دەکەم، ئەگەر دەشتەوێ سەبر بگرەو خێری زیاترە، ئەویش گوتی، دوعـام بۆ بکـە.. پێغـەمبەر ﴿ﷺ﴾یش ئەمری پێ کرد دەستنوێژی هەلگرێو دوو رکاعەت نوێژ بکات و بەو دوعایە بپارێتەوە: ﴿اللهم اني اسالك واتوجه اليك بنبيك نبي الرحمة، يا محمد انما توجهت بك الى ربي في حاجتي هذه لتقضى لي اللهم فشفعه في وشفعني فيـه، قال، ففعل الرجل فبرأ﴾ ـ صحيح ـ رواه احمد.

لەم فەرمـوودەیە دەردەکـەوێ کە پێغـەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەو کاتەی زیندوو بووە، دوعـای بۆ کوێرەکە کردووەو خوداش بۆی قبول کردووە. وە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەمری بە کوێرەکە فەرموو کە خۆی دوعا بۆ خۆی بکات و بە دوعای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە خوا بپارێتەوە، خوداش لێی قبوڵ کرد.

بەڵام ئەم دوعایە تایبەتە بە کاتی ژیانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و پێش مردنی، چونکە سەحابەکان نەیانکردووەو کوێرەکانیش سوودیان لەم دوعایە نەبینیوە لە دوای ئەم رووداوە.

# بەکەمگرتنی دونیا
## « زوهد »

(١) (ئیبنوتەیمیە) دەڵێ :- زوهد وازهێنانە لەو شتانەی کە سوودی ڕۆژی دوایی‌یان نی‌یەو وەرەع وازهێنانە لەو شتانەی کە ترسی زەرەری ڕۆژی دوایی‌یان لێ دەکرێ.
(٢) (سوفیانی سەوری) دەڵێ :- زوهد لە دونیادا کورتی هیوایە نەك بە خۆراکی ڕەق و پۆشینی عەبا.
(٣) (جونەیید) دەڵێ :- زوهد لەم ئایەتە دایە ﴿لكي لا تأسوا على ما فاتكم ولا تفرحوا بما اتاكم والله لا يحب كل مختال فخور﴾ الحديد ٢٣.
مرۆڤی زاهید لە دونیادا شاد نابێ بەوەی کە هەیەتی و خەمبار نابێ بۆ ئەوەی کە نی‌یەتی.
(٤) (ئیبنوجەلاء) دەڵێ :- زوهد بریتی‌یە لە ڕوانینە دونیا بە چاوی نەمان. بەمەش دونیا لەبەر چاوان بچوك دەبێتەوەو پشت تێ‌کردنی ئاسان دەبێت.
(٥) (ئیمام ئەحمەد) دەڵێ :- بریتی‌یە لە شادنەبوون بەوەی دونیا ڕووی تێ بکاو. خەمبارنەبوون بەوەی کە پشتی تێ بکات. جارێك لێیان پرسی :- ئایا پیاوێك هەزار دیناری هەبێ. دەبێ زاهید بێ؟ گوتی :- بەڵێ بە مەرجێك شادنەبێ بەزیاد بوونی و خەمبار نەبێ بەکەم بوونەوەی.
(٦) دیسان (ئیمام ئەحمەد) دەڵێ :- زوهد سێ ڕووی هەیە. یەکەم :- واز هێنان لە حەرام. ئەمەش زوهدی ڕەشۆکی (عوام) خەڵکە. دووەمیش :- واز هێنانە لە حەلاڵە زێدەکی‌یەکان، ئەمەش زوهدی تایبەتمەندەکانە (الخواص) سێ‌یەمیان :- واز هێنانە لەو شتانەی کە لە خوا غافڵ دەکەن، ئەمەش زوهدی خوا ناسانە (العارفين) ئەوەی کە خواناسانیش لە سەری هاودەنگن ئەوەیە کە زوهد سەفەرکردنی دڵە لە نیشتمانی دونیاو نیشتەجێ بوونە لە مەنزڵگاکانی ڕۆژی دوایی.

## ئامانجەکانی ئەم بڵاوکراوەیە:

١- بڵاوکردنەوەی ئەو عەقیدە پاکەی کە سەلەفە ساڵحەکان لە سەری بووینە

٢- بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعی

٣- پەرەپێدانی بیرو هۆشی ئیسلامیانەی موسلمانان



چابخانا روشنبیری هەولیر ١٩٩٤